**لَقَدْ كَانَ جابر بن عبد الله رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما يَمْشِي عَلَى قَدَمَيْهِ أَثْنَاءَ خُرُوجِهِ لِلْجِهادِ لِكَيْ يُغَبِّرَ قَدَمَيْهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ**

**واتـــاكەی**: جابری كوڕی عبد اللّه، **الـلّه تـعـالَى** لەخۆيی و باوكی ڕازی بێت لەكاتی دەرچوونی بۆ جیهاد و تێكۆشان دا بە پێیان دەڕۆیی تاوەكوو پێیەكانی خۆڵاوی ببن لە پێناو **اللّه تـعالَى**

**قَالَ العز بن عبد السلام { إِذَا كَانَتْ مَشَقَّةُ الغُبَارِ عَاصِمَةً مِنْ عَذابِ النَّارِ فَمَا الظَّنُّ بِمَنْ بَذَلَ مَالَهُ وَغَرَّرَ بِنَفْسِهِ فِي قِتَالِ الكُفَّارِ }**[٣٣]

**واتاكەی**: عیززی كوڕی عبد السلام وتوویەتی { ئەگەر تەنها ئەزیەت و ئازاری خۆڵ پارێزەر بێت لە سزای دۆزەخ، دەبێت حاڵی ئەو كەسە چۆن بێت ماڵی خۆی دەبەخشێت و گیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە و بەختی دەكات لە شەڕی كافران دا}

[٣٣] أحكام الجهاد و فضله

## اللَّه لە هەموو تـاوانێكی شەهید دەبورێ جگە لە قەرز

قالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ يُغفَرُ لِلشَّهِيدِ كُلُّ ذَنبٍ، إِلَّا الدَّيْنَ }[34]

واتای فەرموودەکە: **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { **اللَّهُ تَعَالَى** لە هەموو گوناهێكی شەهید خۆش دەبێت جگە لە قەرز نەبێ }

## واتای وشەکان

يُغْفَرُ لِلشَّهِيدِ : لە کەسی شەهید دەبوردرێ

يُغْفَرُ : دەبوردرێت

كُلُّ ذَنْبٍ : هەموو گوناهێك

كُلُّ : هەموو

ذَنْب : گوناح و تاوان

إِلَّا الدَّيْنَ : جگە لە قەرز

إِلَّا : جگە ، بێجگە

الدَّيْنَ : قەرز

[34] رواهُ : مُسْلِمٌ وأحمد والحاكم وابن عوانة والبيهقي والطبراني والبزار

## ڕوونكردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەكە

لە گێڕانەوەیەكی تـردا بەم شـێوەیە هـاتووە { الْقَتْـلُ فِي سَـبِيلِ اللَّهِ يُكَفِّرُ كُلَّ شَيْءٍ، إِلَّا الدَّيْنَ }[٣٥]

**واتـاكەی**: **پـێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { كوژراو لە پێناو **اللّه تـعالَى** هەموو تاوانێكی ڕەش دەكرێتەوە بێجگە لە قەرز }

**إِلَّا الـدَّيْنَ** : جگـە لـە قەرز نەبـێ بە شـەهیدیش ڕەش نـابێتەوە مەگەر بـۆت بدرێتەوە یان خاوەن قەرز بتبورێت

قال ابن الزملكانى { **فِيهِ تَنْبِيهٌ عَلَى أَنَّ حُقُوقَ الآدَمِيِّنَ لَا تُكَفَّر** }[٣٦]

**واتـــــاكەی** { لەم فەرمــوودەدا ئاگـاداركردنەوەیەك هەیە لەسـەر ئەوەی بێگومان مافەكانی بەنی ئادەم ڕەش نابێتەوە و لا ناچێت }

**پرســـیار** // ئایـا قەرزدار بـۆی هەیە بـێ ئیزنی خـاوەن قەرز بچێـتە جیهـاد و تێكۆشـان ؟؟

**وەڵام** // پێشـەوا مالیكی كوڕی ئەنەس و پێشـەوا ئەوزاعی بە دروستیان زانیوە

---

[٣٥] رواه مسلم

[٣٦] البحر المحيط الثجاج المجلد الثاني والثلاثون

فَالإمامُ مالك بن أنس { كَانَ يُرَخِّصُ لِمَنْ عَلَيْهِ دَيْنٌ لَمْ يَسْتَطِعْ قَضَاءَهُ الخُروجَ لِلْجِهَاد}[٣٧]

**واتاكەی**: پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس ڕوخسەتی داوە بۆ ئەو کەسەی قەرزی لەسەرە و توانای داناوەی نییە دەربچێت و بڕوات بۆ جیهاد و تێکۆشان.

{ وَكَانَ الإمامُ الأَوْزَاعِيُّ يُجيزُ لَهُ الخُروج لِلْجِهَاد دُونَ إِذْنِ الدَّائِن }[٣٨]

**واتاكەی**: پێشەوا ئەوزاعی بەدروستی زانیوە دەرچوون بۆ جیهاد و تێکۆشان بەبێ ئیزن و مۆڵەتی خاوەن قەرز.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی دروستە قەرزدار بچێتە جیهاد و تێکۆشان ئەم فەرمودەیە کە لەصحیح البخاري دا هاتووە بەژمارە: ٢٧٨١ و ٤٠٥٣: **عَنِ الشَّعْبِيِّ ، قَالَ : حَدَّثَنِي جَابِرُبْنُ عَبْدِ اللَّهِ ، أَنَّ أَبَاهُ اسْتُشْهِدَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَتَرَكَ سِتَّ بَنَاتٍ، وَتَرَكَ عَلَيْهِ دَيْنًا**

[٣٧] تهذيب كتاب مشارع إلى مَصَارِعِ العُشَّاق

[٣٨] تهذيب كتاب مشارع الأشواق إلى مَصَارِع العُشَّاق

## فەزڵی شەهیدبوون لە پێناو اللَّه

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، وَأَنَّ لَهُ مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ غَيْرُ الشَّهِيدِ، فَإِنَّهُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ، فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ ؛ لِمَا يَرَى مِنَ الْكَرَامَةِ } [٣٩]

واتای فەرموودەکە: **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { هیچ کەسێک نییە بچێتە بەهەشتەوە پێی خۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ دونیا، با هەرچی هەیە هی ئەویش بێت لەسەر زەوی، جگە لە شەهید نەبێ، شەهید خۆزگە دەخوازێت کە بگەڕێتەوە بۆ دونیا دە جار بمرێت و شەهید بکرێت لەبەر ئەو فەزڵ و ڕێز و گەورەییەی بینیویەتی و پێی ئەبەخشرێت - لە ئاخیرەت دا - }

## واتای وشەکان

مَا مِنْ أَحَدٍ : هیچ یەکێک نیە، هیچ کەسێک نییە

مِنْ : وشەی مِنْ لەم فەرموودەیەدا زیادەیە، کەواتە بەم شێوەیەی لێ دێتەوە وَمَا أَحَدٌ

[٣٩] رواه : البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وأحمد والدارمي وابن المبارك وابن حبان والبيهقي وغيرهم

يَدْخُلُ الْجَنَّةَ : بچێته بەهەشت

يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ : پێی خۆش بێت بگەڕێتەوە، حەزبکات بگەڕێتەوە

إِلَى الدُّنْيَا : بۆ دونیا

وَأَنَّ : وە بێگومان

لَهُ : بۆ ئەو هەبێت

مَا عَلَى الْأَرْضِ : ئەوەی لەسەر زەوی هەیە

مِنْ شَيْءٍ : لە شت، شَيْءٍ نەکیرەیە بچووکترین شت تا گەورەترین شت دەگرێتەوە

غَيْرُ الشَّهِيدِ : جگە لە شەهید

فَإِنَّهُ : جا بێگومان شەهید، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی الشَّهِيد

يَتَمَنَّى : خۆزگە دەخوازێت، تەمەنا دەکات

أَنْ يَرْجِعَ : بگەڕێتەوە

فَيُقْتَلَ : جا بکوژرێ

عَشْرَ مَرَّاتٍ : دە جار، مَرَّاتٍ جەمع و کۆیە بۆ وشەی مَرَّة

لِمَا يَرَى : لەبەر ئەوەی ئەیبینێت، بەهۆی ئەوەی ئەیبینێت

مِنَ الْكَرَامَةِ : لەرێز و گەورەیی و فەزڵ

##  ڕوونكردنەوەی زیاتر لەسەر ئەم فەرموودەیە

**فَإِنَّـهُ يَتَمَنَّـى أَنْ يَرْجِـعَ** : ئەو هیـواو خـۆزگەیە ئەگەرچی لەخـودی خـۆی دا مەحـاڵە و نـایەتە دی بەڵام شـەهید ئەو خـۆزگەیە ئەخوازێـت لەبەر ئەو هەموو فەزڵ و گەورەییەی كە **اللّه تعالَى** دەیبەخشی بە شەهیدان

**ابـن بطـال** وتـوویەتی { **هَـذَا الحَـديثُ أَجَـلُّ مَـا جَـاءَ فِي فَضْـلِ الشَّـهَادَةِ، قَـالَ: وَلَيْسَ فِي أَعْمَالِ البِرِّمَا تُبْذَلُ فِيهِ النَّفْسُ غيرَ الجِهَاد، فَلِذَلِكَ فِيهِ عَظمَ فِيهِ الثَّواب** }[٤٠]

**واتــاكەی** { ئەم فەرمـوودەیە گەورەتـرین فەرمـوودەیە هـاتووە لەسـەر فەزڵ و گەورەیی شـەهید، وە وتـوویەتی ئیبن بەطال: هیچ كردەوەیەكی چاكە نییە كە گیـانی تێـدا بەخـت كرێـت جـگە لە جیهـاد و تێكۆشـان، هەر بـۆیەش پاداشـتی شـەهید گەورەیە }

[٤٠] فتح الباري بشرح صحيح البخاري

## ئەوەی برینداركراوە لە پێناو اللّە

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ وَالَّـذِي نَفْسِـي بِيَـدِهِ، لَا يُكْلَـمُ أَحَـدٌ فِـي سَـبِيلِ اللَّهِ - وَاللَّهُ أَعْلَـمُ بِمَـنْ يُكْلَـمُ فِي سَـبِيلِهِ - إِلَّا جَـاءَ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ وَاللَّـوْنُ لَوْنُ الدَّمِ، وَالرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ }[٤١]

### واتای فەرموودەکە:

**پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ یەكێك بریندار ناكرێت لەپێناو **اللّە تَعالَى** - وە **اللّە تَعالَى** زاناترە بەو كەسەی لەپێناوی دا بریندار دەكرێ - ئیللا ئەو بریندار كراوە لەڕۆژی قیامەت دا دێت، ڕەنگەكەی ڕەنگی خوێنە، بۆنەكەی بۆنی میسكە }

### واتای وشەکان

وَالَّذِي : سوێند بەوەی ، سوێند بە **اللّە تَعالَى**

نَفْسِي : گیانی من ، نەفسی من

بِيَدِهِ : بەدەستییەتی، بەدەست ئەوە، بەدەست **اللّە**یە

[٤١] رواه : البخاري و مسلم و الترمذي و النسائي و ابن ماجه و أحمد و مالك

**لَا يُكْلَمُ** : بريندار ناكرێت ، زامدار ناكرێ

**أَحَدٌ** : یەكێک، كەسێک

**فِي سَبِيلِ اللَّهِ** : لە ڕێگەی **اللّه تَعالَى** ، لەپێناو **اللّه تعالَى**، لە جیهاد و تێكۆشان دا

**وَاللَّهُ أَعْلَمُ** : وە **اللّه تَعالَى** زاناترە

**بِمَنْ** : بەو كەسەی

**يُكْلَمُ** : زامدار دەكرێ ، بریندار دەكرێ

**فِي سَبِيلِهِ** : لە پێناو خۆی دا ، لەڕێگای خۆی دا ، لەپێناو **اللّه تَعالَى**

**إِلَّا جَاءَ** : ئیللا دێت ( كەسە بریندار كراوەكە دێت ) خۆی جَاءَ كاری ڕابردووە بەواتای هات دێت

**يَوْمَ الْقِيَامَةِ** : ڕۆژی قیامەت

**اللَّوْنُ** : ڕەنگی { ڕەنگی خوێنی بریندارکراوەكە }

**لَوْنُ الدَّمِ** : ڕەنگی خوێنە

**الدَّمِ** : خوێن

**الرِّيحُ** : بۆن { بۆنی خوێنی بریندارکراوەكە }

**رِيحُ الْمِسْكِ** : بۆنی میسكە

## ڕوونكردنەوەی زیاتر لەسەر ئەم فەرموودەیە

وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ : ابن عبد البر وتوویەتی دەربارەی، وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ، { دَليلٌ عَلَى أَنَّهُ لَيْسَ كُلُّ مَنْ خَرَجَ إِلَى الغَزْوِ تَكُونُ هَذِهِ حَالُـهُ حَتَّـى تَصِـحَّ نِيَّتـهُ وَيَعْلَـمُ اللَّهُ مِـنْ قَلْبِـهِ أَنَّـهُ خَـرَجَ يُريـدُ وَجْهَـهُ، وَمَرْضَاتَهُ...... }[42]

**واتاكەی** { ئەم برگەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەرج نییە هەركەسێک بچێتە جەنگ و جیهاد ئەوە حاڵی بێت تا ئەو كاتەی نیەتی چاک و پاک دەكات، وە **اللَّه** زانایە بە دڵی ئەو كەسە، كە ئایا دەرچووە لەبەر ذاتی **اللَّه** و مەبەستی ڕەزامەندی **اللّه** بووە .... }

وَاللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ، وَالرِّيحُ رِيحُ الْمِسْكِ: قَالَ ابن عبد البر { هَذَا مِنْ أَحْسَنِ حَدِيثٍ فِي فَضْلِ الغَـزْوِ فِي سَبيلِ اللَّهِ، والحَـضِّ عَلَى الثُّبُوتِ عِنْدَ لِقَاءِ العَدُوِّ}[43]

**واتـــاكەی** { ئەو فەرموودەیە چاكترین فەرموودەیە لەسەر فەزڵ و گەورەیی جیهاد كردن لە پێناو **اللَّه** و هاندان لەسەر جێگیربوون لەكاتی گەیشتن بەدوژمن دا }

ئەو كەسەی لە پێناو **اللّه تَعالَى** دا بریندار دەكرێ ئەو خوێنەی كە لێی دێت ڕەنگەكەی هەمان ڕەنگی خوێنە بەڵام بۆنەكەی وەكوو بۆنی میسک وایە لە ڕۆژی قیامەت دا

---

[42] الإستذكار: ٥ / ٩٩

[43] التمهيد: لابن عبد البر

## حەزكردن و خۆزگە خواستن بە شەهید بوون

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ثُمَّ أَحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ، ثُمَّ أَحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ }[٤٤]

واتای فەرموودەکە: **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی {سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە بێگومان پێم خۆشە بکوژرێم لە پێناو **اللّه تَعالَى** پاشان زیندوو بکرێمەوە، پاشان بکوژرێمەوە پاشان زیندوو کرێمەوە، پاشان بکوژرێمەوە پاشان زیندووکرێمەوە، پاشان بکوژرێمەوە }

### واتای وشەکان

وَالَّذِي : سوێند بەوەی ، سوێند بە **اللّه**

نَفْسِي : گیانی من

بِيَدِهِ : بەدەستییەتی، بەدەست ئەوە، بە دەست **اللّه** یە

وَدِدْتُ : پێم خۆش بوو

أَنِّي : بێگومان من

أُقْتَلُ : بکوژرێم

فِي سَبِيلِ اللَّهِ : لەڕێگای **اللّه تَعالَى**، لە جیهاد دا

ثُمَّ : پاشان

أُحْيَا : زیندووبکرێمەوە

[٤٤] رواه : البخاري و مسلم و النسائي وابن ماجه ومالك وأحمد والدارمي وغيرهم

##  ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەکە:

قَالَ ابن الملقن { أَنَّ بَعْضَ النَّاسِ زَعَمَ أَنَّ قَوْلَهُ: وَدِدْتُ " مُدْرَجٌ مِنْ كَلامِ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: وَهُوَ بَعِيدٌ }

**واتـاکەی** { بەڕاستی هەندێک لە خەڵکی وا گومانیان بردووە وتەی وَدِدْتُ ئەم زیـادەیە قسـەی ئەبـو هـورەیرەیە، ابـن الملقـن وتـویەتی ئەمە شـتێکی دوورە بەڵکوو وتەی **پـێغەمبەرە** ﷺ }

**أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ** : هەندێ لەو زانایانەی شـەرحی ئەم فەرموودەیان کردووە لێیان تێکەڵ بووە و وتوویانە ئەو پێخۆش بوونە بۆ **پـێغەمبەر** ﷺ و لەگەڵ وەشـدا **پـێغەمـبەر** ﷺ زانیـویەتی کەوا نـاکوژرێ، **ابـن التـین** وەڵامی ئەوەی داوەتەوە و دەڵێـت { **بِـأَنَّ ذَلِـكَ لَعَلَّـهُ كَـانَ قَبْـلَ نُـزُولِ قَوْلِـهِ تَعَـالَى** { **وَاللَّهُ يُعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ** }

**واتــا**: ئەو پێخـۆش بـوونەی **پـێغەمـبەر** ﷺ بـۆ شـەهیدبوون ڕەنگە پێش هاتنە خـوارەوەی ئەم ئایەتە بوو بێت { وَاللَّهُ يُعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ } واتا { **اللـّه تَعالَى** دەتپارێزێت لە دەستی خەڵکی }

لە پاشـان مەرج نیـیە هەمـوو پێخـۆش بوونێـک بـۆ هـاتنەدی بێـت، هەروەک **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { **يَرْحَمُ اللَّهُ مُوسَى، لَوَدِدْتُ أَنَّهُ كَانَ صَبَرَ حَتَّى يُقَصَّ عَلَيْنَا مِنْ أَخْبَارِهِمَا** } رواه مسلم وغيره

## کوژراو لە پێناو اللّە بۆ بەهەشتە

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ يَضْـحَكُ اللَّهُ إِلَـى رَجُلَـيْنِ يَقْتُـلُ أَحَـدُهُمَا الْآخَـرَ، يَـدْخُلَانِ الْجَنَّـةَ، يُقَاتِـلُ هَـذَا فِي سَـبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَـلُ، ثُـمَّ يَتُـوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُسْتَشْهَدُ }[٤٥]

**واتای فەرموودەکە:** **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { **اللّە تَعالَی** پێ ئەکەنێت بە دوو پیاوان یەکێکیان ئەوی تریان ئەکوژێت، هەردووکیان ئەچنە بەهەشتەوە، ئەویان ئەجەنگێ لە پێناو **اللّە تَعالَی** جا ئەکوژرێت، پاشان **اللّە تَعالَی** تەوبە لە بکوژەکە قەبوڵ دەکات پاشان ئەویش شەهید دەکرێت }

### واتای وشەکان

يَضْحَكُ اللَّهُ : **اللّە تَعالَی** پێ ئەکەنێت ( پێکەنینێک لە جوانی خۆی بوەشێتەوە دوور لە پێکەنینی دروستکراوەکانی )

إِلَى رَجُلَيْنِ : بۆ دوو پیاوان

[٤٥] رواه : البخاري ومسلم والنسائي وابن ماجه ومالك وأحمد وابن خزيمة وابن حبان والبيهقي

يَقْتُلُ : دەكوژێ

أَحَدُهُمَا : یەكێكیان، یەكێک لەو دوو پیاوە، وشـەی هُمَا دەگەڕێتەوە بۆ رَجُلَيْنِ

الْآخَرَ : ئەوی تریان

يَــدْخُلَانِ الْجَنَّــةَ : دەچــنە بەهەشــتەوە، ئەو دوو پیــاوە دەچــنە بەهەشتەوە

يُقَاتِلُ هَذَا : ئەویان دەجەنگێ

فِي سَبِيلِ اللَّهِ : لە پێناو **اللّه**

فَيُقْتَلُ : جا دەكوژرێ

ثُمَّ : پاشـان

يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ : **اللّه** تەوبە لە بكوژەكە وەردەگرێت ( مسـولْمان دەبێت بكوژەكە)

فَيُسْتَشْهَدُ : جا شـەهید دەكرێت، پاشـان بكوژەكەش شـەهید دەبێت لە پێناو **اللّه تَعالَی** دا، بە شـەهیدی دەمرێت

##  چەند ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ئەم فەرموودەیە

**يَضْحَكُ اللَّهُ** : **اللّـه تَعـالَى** پێ ئەکەنێت، یەک لە صیفەتەکانی **اللّـه تَعـالَى** پێکەنینـە بەڵام پێکەنینێـک لە جـوانی و گەورەیـی خـۆی بوەشـێتەوە دوور لە پێکەنینی دروسـتکراوەکانی ئەمەش وتەی سـەلەفە، بەڵام ابـن الجـوزي و الخطابي و ابن حجر و النووی و هاوشێوەکانیان دەڵێن مەبەست لە پێکەنین بـریتییە لە ڕازی بـوون و ڕەحـمەت ئەوە ڕاسـت نیـیە و مەزهەبە بـاتڵەکەی جەهمییەکان و موعتەزیلەکان و ئەشـعەرییەکانە، **الـلّـه تَـعـالَى** لە شـەڕیان بمان پارێزێت

**فِي سَبِيلِ اللَّهِ** : بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای تەوحید و **لَا إِلَهَ إِلَّا اللّه**

**فَيُسْتَشْهَدُ** : أي : يموتُ شَهيداً، بە شەهیدی دەمرێت

**يَدْخُلَانِ الْجَنَّةَ** : هەردووکیان دەچنە بەهەشتەوە

ابن عبد البر وتوویەتی { **يُسْتَفَادُ مِنْ هَذا الحَديثِ أَنَّ كُلَّ مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَهُوَ فِي الجَنَّةِ** }

**واتـــاکەی** { ئەم فەرمـوودەیە سـوودی ئەوەی لێوەردەگیرێـت بێگومـان هەر کەسێک بکوژرێت لە پێناو **اللّه تَعالَى** دا ئەوە لە بەهەشتە }

**يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ** : **اللّه** تەوبە لە بکوژ وەردەگرێت، عیبرەت بە کۆتاییەو عاقیبەت گرنگە، موجاهید ئەکوژێ و پاشان تەوبە دەکات کەچی **اللّه تَعالَى** لێشی خۆش دەبێ و دەشیباتە بەهەشتەوە

## کوژراو لەپێناو اللّٰه بۆ بەهەشتە

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ : قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ أُحُدٍ { أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فَأَيْنَ أَنَا ؟ قَالَ : فِي الْجَنَّةِ " فَأَلْقَى تَمَرَاتٍ فِي يَدِهِ، ثُمَّ قَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ }[٤٦]

**واتای فەرموودەکە**: جابری کوڕی عبدالله فەرموویەتی پیاوێک لەڕۆژی ئوحود بەپێغەمبەری فەرموو { هەواڵم بدێ ئەگەر کوژرام لەپێناو **اللّٰه** شوێنم کوێیە؟ **پێغەمبەر** ﷺ فەرمووی لە بەهەشتە ، جا ئەم پیاوە ئەو چەند خورمایەی لەناو دەستی بوو فرێی دا ، لەپاشان جەنگا تاوەکوو کوژرا )

### واتای وشەکان

رَجُلٌ : پیاوێک

يَوْمَ أُحُدٍ : ڕۆژی ئوحود ، جەنگی ئوحود

أَرَأَيْتَ : هەواڵم بدێ ، پێم ڕابگەیەنە

إِنْ : ئەگەر

قُتِلْتُ : کوژرام

أَيْنَ : لە کوێ

[٤٦] رواه : البخاري ومسلم والنسائي وابن المبارك والحميدي وأحمد وأبو يعلى والبيهقي

**أَنَا** : من

**فِي الْجَنَّةِ** : لەبەهەشت

**أَلْقَى** : فڕێی دا ، تێی هەڵدا

**تَمَرَاتٍ** : خورمایەکان، تَمَرَات کۆی تَمْرَة یە تَمْرَة واتا یەک خورما

**قَاتَلَ** : جەنگا ، شەڕی کرد

**حَتَّى** : هەتا ، تاوەکوو

**قُتِلَ** : کوژرا ، شەهیدکرا

## ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەکە

**إِنْ قُتِلْتُ** : أي : إنْ قَتَلَنِي العَدُوُّ ، ئەگەر دوژمن منی کوشت

**فِي الْجَنَّةِ** : ثُبُوتُ الْجَنَّةِ لِلشَّهِيدِ: جێگیرکردنی بەهەشت بۆ کەسی شەهید

هـاوەڵانی **پێغەمـــــــبەر** ﷺ خۆشەویســتییەکی تەواویــان هەبــووە بــۆ سەرخســتنی ئیسلام و مردن لە پێناوی **الـلّە تَعــالَى** دا بۆیە حەزناکات ئەو چەند دەنکە خورمایە تاخیری بکات بۆ چوونە بەهەشتەکەی **اللَّه**

## کوژراو لەپێناو اللّٰه بۆ بەهەشتە

عَنِ الْبَرَاءِ ، قَالَ { جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي النَّبِيتِ قَبِيلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّكَ عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. ثُمَّ تَقَدَّمَ، فَقَاتَلَ، حَتَّى قُتِلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : عَمِلَ هَذَا يَسِيرًا، وَأُجِرَ كَثِيرًا }[٤٧]

واتــــای فەرمــــوودەکە: لە بەڕائی کوڕی عـازیبەوە فەرمـوویەتی {پیاوێک هـات لەبەنی نەبیت کە بەرەیەکن لە ئەنصـار، جا فەرمـووی: شـایەتی دەدەم کە هیچ پەرسـتراوێک نییە بپەرسـترێت بەحەق و ڕاستی جگە لە **اللّٰه تـعـالَى** نەبێت، وە بێگومان تۆش بەندە و نێردراوی **اللّٰەی**، پاشـان پێشـکەوت و جەنگا هەتـا کـوژرا، **پـێغەمــبەر** ﷺ فەرمـووی: ئەم پیاوە کردەوەی کەم کرد و پاداشتی زۆری پێدرا }

### واتای وشەکان

جَاءَ رَجُلٌ : پیاوێک هات

مِنْ بَنِي النَّبِيتِ : لەنەوەی نەبیت، نەوەی نەبیت هۆزێکن لە ئەنصار

---

[٤٧] رواه : البخاري و مسلم وأحمد وابن أبي شيبة والطيالسي وابن حبان وابن مندة والبيهقي وأبو عوانة

قَبِيلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ : كۆمەڵێكن لە یاریدەدەران، قَبِيل واتا جەماعەت و كۆمەڵ وەک فەییومی وای وتووە

فَقَالَ : جا پیاوەكە وتی

أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ : شـايەدی دەدەم كە هـيچ پەرسـتراوێک نيـيە بپەرسترێت بەحەق و ڕاستی جگە لە **اللّه** نەبێ

وَ أَنَّكَ عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ : وە بێگومان تۆ بەندە و نێردراوی **اللّه تَعالَى**ی

ثُمَّ تَقَدَّمَ : پاشان پێش كەوت، پێش كەوت بەرەو ڕووی دوژمن

فَقَاتَلَ : جا جەنگا، پاشان شەڕی كرد

حَتَّى قُتِلَ : هەتا كوژرا

فَقَالَ النَّبِيُّ : **پێغەمبەر**ﷺ فەرمووی

عَمِلَ هَذَا يَسِيرًا : ئەو پیاوە كردەوەی كەم كرد

وَأُجِـرَكَثِيـرًا : پاداشــتێكی زۆری درایەوە، پاداشــتی زۆری پێــدرا، پاداشتێكی زۆری پێبەخشرا

## ڕوونكردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەكە

لە صەحیحی بوخاری دا بەم شێوەیە هاتووە ئەو پیاوە دەڵێت { **يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُقَاتِلُ وَأُسْلِمُ ؟ قَالَ : أَسْلِمْ ثُمَّ قَاتِلْ " فَأَسْلَمَ ثُمَّ قَاتَلَ، فَقُتِلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : عَمِلَ قَلِيلًا وَأُجِرَ كَثِيرًا** }[48]

**واتـــاكەی**: ئەی نێردراوی **الـلّە** بجەنگم و مسـوڵمان بم ؟ **پێغەمــبەر** ﷺ فەرمـووی مسـوڵمانبە پاشـان بجەنـگە، جـا مسـوڵمان بـوو پاشـان جەنگاو شـەڕی كرد، پاشـان كوژرا، **پێغەمــبەر** ﷺ فەرمـووی ئەم پیـاوە كردەوەی كەم كرد و پاداشتی زۆری پێدرا }

**يَسِـيرًا** : سـیفەتە بـۆ مەصـدەرێكی ڕەشـكراو، وای لـێ دێـتەوە عَمَـلًا يَسِـيرًا كردەوەیەكی كەم

**وَأُجِرَكَثِيرًا** : أي أعطي أجرا كثيرا ، پاداشتێكی زۆری پێبەخشرا، چونكە كوژراو لە پێناو **اللّە تعالَی** بۆ بەهەشتە وەک لە فەرموودەكانی ڕابردوودا باسمان كرد

**قَـالَ الحسـن البصـرِي** رَحِمَهُ اللَّهُ { **إِنَّ لِكُلِّ طَرِيقٍ مُخْتَصَراً وَمُخْتَصَرُطَرِيقِ الجَنَّةِ الجِهادُ** }[49]

---

[48] رواه البخاري

[49] حلية الأولياء

**واتـــــاكـەی**: پێشـەوا حەسـەنی بەسـرِی فەرمـوویەتی { بێگومـان بـۆ هەمـوو ڕێگایەک کورت کراوەیەک هەیە، وە کورت کراوەی ڕێگای بەهەشتیش بریتییە لە جیهاد و تێکۆشان }

**قَالَ شيخ الإسلام إبن تيمية رَحِمَهُ اللَّهُ تَعَالَى { مَنْ كَانَ كَثِيرُ الذُّنُوبِ فَأَعْظَمُ دَوَائِهِ الجِهَادُ }**[50]

**واتـــــاكـەی**: ئیبن تەیمیە فەرمـوویەتی { هەرکەسـێک گونـاهو تـاوانی زۆرە گەورەترین چارەسەری بریتییە لە کردنی جیهاد و تێکۆشان }

[50] مَجْموع الفتاوى

## ئەزیەت و ئازاری مردنی شەهید

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ مَـا يَجِـدُ الشَّــهِيدُ مِـنْ مَـسِّ الْقَتْـلِ، إِلَّا كَمَـا يَجِـدُ أَحَـدُكُمْ مِنْ مَسِّ الْقَرْصَةِ }[٥١]

**واتـــای فەرمــــوودەکە:** **پێغەمـــبەر** ﷺ فەرمـوویەتی {کەسی شـــەهید ئەزیەت و ئــازاری کوشـــتن نابینێـــت، مەگەر وەکـــوو ئەوەی یەکێک لە ئێوە لە ئەزیەت و ئازاری قونجورکەیەک ئەیبینێت }

### واتای وشەکان

مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ : شەهید نابینێت، هەست ناکات شەهید

مِنْ مَسِّ الْقَتْلِ : لە ئەزیەت و ئازاری کوشتن و مردن

إِلَّا كَمَا يَجِدُ : مەگەر وەکوو ئەوە بیبینێت

أَحَدُكُمْ : یەکێک لە ئێوە

مِنْ مَسِّ : لە ئەزیەت و ئازاری

مَسِّ : ئەزیەت و ئازار

الْقَرْصَةِ : قونجـورکە، قـونجرک گـرتن، قونجیلکـە، گرتنی گۆشـتی کەسێک بە دوو پەنجان

---

[٥١] رواهُ : التِّرْمِذي والنسائي وابن ماجة وأحمد والطبراني، صَحَّحَهُ سُليْمانُ بنُ ناصرِ العُلْوانُ

##  ڕوونكردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەكە

وشەی شەهید واتا كوژراو لە پێناو **اللّه تَعالَی**

**پرسیار**/ بۆچی ناونراوە بە شەهید ؟

**وەڵام**/ *ئیبن ئەنباری* دەڵێت { **سُمِّيَ شَهِيداً لِأَنَّ اللّهَ وَ مَلائِكَتَهُ يَشْهَدُونَ لَهُ بِالجَنَّة** }

**واتاكەی** { بۆیە ناونراوە شەهید چونكە **اللّه تَعالَی** و مەلائیكەتەكانی شایەدی بەهەشتی بۆ دەدەن }

وە وتراوە دەربارەی { **سُمِّيَ بِذَلِكَ لِأَنَّهُ عِنْدَ خُروجِ رُوحِهِ يَشْهَدُ مَا أَعَدَّ اللّهُ لَهُ مِنَ الثَّوابِ والكَرامَةِ** }

**واتاكەی**: بۆیە ناونراوە شەهید چونكە لە كاتی دەرچوونی ڕوحی دا ئەوەی **اللّه** ئامادەی كردووە لە پاداشت و ڕێز دا ئەیبینێ }

هەر لە فەزڵ و گەورەیی شەهید فەرموودەیەك باس دەكرێت لە **پێغەمبەرەوە** ﷺ، ئەگەرچی فەرموودەكەش قسەی لەسەرە و هەیە لە زانایان دەفەرمووێت فەرموودەیەكی لاوازە، ئەوەش فەرموودەكەیە { **لِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللّهِ سِتُّ خِصَالٍ : يُغْفَرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دَفْعَةٍ، وَيَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُجَارُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَيَأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ الْأَكْبَرِ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ**

الْوَقَارِ، الْيَاقُوتَةُ مِنْهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَيُزَوَّجُ اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ زَوْجَةً مِنَ الْحُورِ الْعِينِ، وَيُشَفَّعُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَقَارِبِهِ}[٥٢]

**واتای فەرموودەکە** { بۆ شەهید هەیە لەلای **اللَّه تعالَى** شەش ڕەوشت و خەسڵەت، لەگەڵ دەرچوونی یەکەم دڵۆپە خوێنی لە هەموو تاوانێکی دەبوردرێ، وە شوێنی خۆی دەبینێت لە بەهەشت دا، وە لە سزای گۆڕ دەپارێزرێت، وە لە ترسە گەورەکە ئەمین دەبێت، وە تانجی ڕێزی لەسەر سەر دادەنرێت یەک یاقوت لەو تانجە لە دونیا و ئەوەی تێیدایە باشترە وە حەفتا و دوو حۆری چاوگەشی پێ دەدرێ، وە شەفاعەت دەکات بۆ حەفتا کەس لە کەسە نزیکەکانی }

قَالَ سليمان بن ناصر العلوان { وَلَا يَخْتَلِفُ أَنَّ مَنْزِلَةَ الشَّهِيدِ فِي الجَنَّةِ مِنْ أَعْظَمِ المَنَازِلِ، وَدارَهُ مِنْ أَحْسَنٍ وَأَفْضَلِ الدُّورِ، وَمَيْتَتُهُ مِنْ أَيْسَرِ المَيْتاتِ وَأَفْضَلِها، وَأَنَّهُ تَعَالَى يَجْعَلُ فِي قَلْبِ المُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قُوَّةً وَثَبَاتاً وَإِقْدَاماً مَا لا يَجْعَلُهُ فِي قَلْبِ غَيْرِهِ، فَلا يَخافُ مِنَ العَدُوِّ، وَلا يَرْهَبُ قُوَّتَهُمْ وَلا كَثْرَتَهُمْ }[٥٣]

**واتاکەی**: سولەیمانی کوڕی ناصر العلوان وتوویەتی { جیاوازی نییە لەوەی بێگومان پلە و پایەی شەهید لە بەهەشت دا لەگەورەترینی پلەو پایەکانە، وە ماڵی شەهید لە جوانترین و باشترینی ماڵەکانە، وە مردنەکەی ئاسانترین و

---

[٥٢] رَوَاهُ التِّرْمِذي وابن ماجة وأحمد

[٥٣] الأربعون الجهادية

باشترینی مردنەکانە، وە **اللّه تَعالَی** لەدڵی موجاهیدی لە پێناو خۆی دا هێز و ثەبات و بوێری داناوە، کە لەدڵی یەکێکی تری دانەناوە جگە لە دڵی شەهید نەبێ، موجاهید ناترسێت لە دوژمن، وە هەڵنایێت لەبەر هێزو قوەتیان، وە هەڵنایێت لە ژمارە زۆری دوژمن }

## داواكردنی شەهیدی لە اللّٰه تَعالَی

قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ

{ مَـنْ سَـأَلَ اللَّهَ الشَّـهَادَةَ بِصِـدْقٍ بَلَّغَـهُ اللَّهُ مَنَـازِلَ الشُّـهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ }[٥٤]

واتای فەرموودەكە: **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی {هەركەسێک داوای شـەهیدی كـرد لە **الـلّٰه تَعـالَی** بەڕاسـتگۆیی، ئەوە **الـلّٰه تَعـالَی** دەیگەیەنێتە پلەی شـەهیدان ئەگەرچی لەسـەر جێگایەكەی خۆشی دا مردبێت }

### واتای وشەكان

مَنْ : هەركەسێک

سَأَلَ : داوای كرد

الشَّهَادَةَ : شـەهیدی

بِصِدْقٍ : بەڕاستگۆیی

[٥٤] رواه : مسلم وأبو داود والنسائي والترمذي وابن ماجه والدارمي والطبراني وابن حبان والبيهقي وابن المبارك وغيرهم

بَلَّغَهُ اللَّهُ : **اللّه تعالَى** دەيگەيەنێت، **اللّه** ئەو كەسە دەگەيەنێت، بَلَّغَهُ ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی مَنْ

مَنَازِلَ : مَنَازِلَ جەمع و كۆيە بۆ وشەی مَنْزِل، مَنْزِل واتا پلە ، روتبە، مَنْزِل بەواتای ماڵیش دێت

الشُّهَدَاءِ : شەهیدەكان، وشەی الشُّهَدَاءِ جەمع و كۆيە بۆ وشەی شَهيد

مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ : پلەی شەهیدان

إِنْ : ئەگەر

مَاتَ : مرد

عَلَى : لەسەر

فِرَاشِهِ : جێگاكەی، جێگای خۆی

## چەند ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ئەم فەرموودەیە

**وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ** : أي: وَإِنْ لَمْ يُقْتَلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، ئەگەر چی نەکوژرابێت لە جیهاد لە پێناو **اللّه تَعالَى**

**بِصِدْقٍ** : لِأَنَّ الصِّدْقَ مِعْيارُ الأَعْمال ، چونکە ڕاستگۆیی پێوانی کردەوەکانە

ئەم فەرموودەیە بە شێوەی تریش هاتووە لە **پێغەمبەرەوە** ﷺ، بەم شێوەیە { **مَنْ طَلَبَ الشَّهَادَةَ صَادِقًا أُعْطِيَهَا وَلَوْلَمْ تُصِبْهُ** }[٥٥]

**واتای فەرموودەکە** { هەرکەسێک داوای شەهادەت بکات بەڕاستگۆیی ئەوە پێی دەبەخشرێت ئەگەر تووشیشی نەبوو بێت }

## پیاو چاکانی ئوممەت داوای شەهیدیان کردووە لە الله تعالى

پێشەوا **عومەری کوڕی خەتاب** فەرموویەتی { **اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ وَوَفَاةً بِبَلَدِ رَسُولِكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ~ فَاسْتَجابَ اللَّهُ لَهُ وَرَزَقَهُ الشَّهَادَةَ فِي المَدِينَة** }[٥٦]

---

[٥٥] رواه مسلم

[٥٦] رواه البخاري

**واتــاكــەی** { ئەی **الـلّـه تَـعـالَى** من داوای شـەهیدیت لێ دەکەم لەپێناو خۆت، وەداوات لێ دەکەم بمـرم لەشـاری **پێغەمـــبەرەکەت** ﷺ~ **الــلّـه تَـعـــالَى** داوایەکەی وەرگرت و شـەهیدی پێ بەخشی لەشاری مەدینەدا }

وە **عەمـــری کـــوڕی عـــاص** فەرمـوویەتی { **شَـهِدْتُّ أَنـا وَأَخي هِشـامٌ مَعْرَكَـةَ اليَرْمُـوك ، فَبِتْـنَـا نَـدْعُـو اللَّهَ أَنْ يَرْزُقَـنَـا الشَّـهادَةَ، وَلَمَّـا أَصْـبَحْنَا رَزَقَـهُ اللَّهُ الشَّهَادَةَ وَحَرَمَنِي إِيَّاهَا**}[٥٧]

**واتــاکــەی**: { من و هیشـامی برام ئامادەی شـەڕی یەرمووک بووین ، جا شـەو ماینەوە داوامان لە **اللّه تَعالَى** کرد کە شەهیدیمان پێ ببەخشێت، لەوکاتەی بەیانیمان کردەوە **الـلّـه تَـعـالَى** شـەهیدی بەخشی بەهیشـام و منیش بێبەش بووم لێی }

## فەزڵ و گەورەیی شەهید لە قورئان دا

**اللّه تَـعـالَى** فەرموویەتی { وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَـٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَـٰئِكَ رَفِيقًا}
[سورة النساء : ٦٩ ]

**واتــاکــەی** { هەرکەسێک گوێڕایەڵی **الـلّـه** و **پێغەمـبەرەکەی** ﷺ بکات ئەوە لەگەڵ ئەو کەسـانەیە - لە قیامەتـدا -کە **الــــلّـه** نیعمەتـی خـۆی بەسـەردا

---

[٥٧] كتاب: تهذيب كتاب مشارع الأشواق إلى مصارع العشاق

بارانـدوونه لـه پێغـهمبـهران و ڕاسـتگۆیان و شـههیدان و چاكهكاران، ئهوانهش جوانترین و باشترین دۆست و ڕهفیقن مرۆڤ دۆستایهتیان بكات }

وه **اللَّه تَعالَى** فهرموویهتی { إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَىٰ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ } [ سورة التوبة : ١١١ ]

**واتـاكـهى** { بێگومان **اللَّه تَعالَى** گیان و ماڵی له بڕواداران كڕیوه لهبری ئهوهدا بهههشتیان پێدهبهخشێت }

له ئایهتێكی تردا **اللَّه تَعالَى** فهرموویهتی { وَلَا تَقُولُوا لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌۢ بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ }[ سورة البقرة : ١٥٤ ]

**واتـاكـهى** { بهو كهسه مهڵێن مردوو كه له پێناو **اللَّه تَعالَى** دهكوژرێ، بهڵكو زیندوونه بهڵام ئێوه ههستی پێ ناكهن }

وه ههروهها دهفهرمووێت { وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًاۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ }[ سورة آل عمران : ١٦٩ ]

**واتـاكـهى** { وا گومان مهبهن بهوانهى كوژراون له پێناو **اللَّه تَعالَى** مردوون، بهڵكوو ئهوانه زیندوون لهلاى پهروهردیگاریان ڕزق و ڕۆزیان پێ دهدرێ }

ئایهت زۆر هاتووه دهربارهى گهورهیی موجاهیدان و شـههیدان بهڵام ئهوهنده كافیه و درێژتری ناكهمهوه

## فەزڵی دەرچوون بۆ جیهاد لە پێناو اللّە تَعالَی دا

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{تَكَفَّلَ اللَّهُ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ مِنْ بَيْتِهِ إِلَّا جِهَادٌ فِي سَـبِيلِهِ، وَتَصْـدِيقُ كَلِمَتِـهِ بِـأَنْ يُدْخِلَـهُ الْجَنَّـةَ، أَوْيَرْجِعَـهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ، أَوْغَنِيمَةٍ}[٥٨]

**واتای فەرموودەکە:** **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی {**اللّە تَعالَی** لەسەر خۆی پێویستکردووە بۆ ئەو کەسەی کە لە پێناوی دا تێدەکۆشێت، هیچ شتێک ئەو کەسەی دەرنەهێنابێت لەماڵەکەی دا بێجگە لە تێکۆشان لە پێناو خۆیی و بەڕاست دانانی وشەی خۆی، بەوەی بیخاتە بەهەشتەوە - ئەگەر کوژرا - یان بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ماڵەی کە لێی دەرچووە لەگەڵ ئەوەشی بەدەستی هێناوە لە ئەجر و پاداشت دا یان لە غەنیمەت و دەستکەوت دا}

[٥٨] رواه : البخاري ومسلم والنسائي وابن ماجه ومالك وابن المبارك وأحمد والدارمي وابن حبان والبيهقي

## واتای وشەکان

تَكَفَّلَ اللَّه : **الـلّه** لە ئەستۆی گرتووە، لەسەر خۆی پێویست کردووە، خۆی پابەند کردووە، **اللّه** زامینی کردووە

لِمَنْ : بۆ ئەو کەسەی

جَاهَدَ : جیهادی کرد، تێکۆشا

فِي سَبِيلِهِ : لە پێناو خۆی، لە پێناو **اللّه تعالَى**، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی **اللّه**

لَا يُخْرِجُهُ : دەری نەکات، ئەو کەسە دەر نەهێنێت، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی مَنْ

إِلَّا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ : ئیللا تێکۆشان لە پێناو خۆی نەبێ، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی **اللّه**

وَتَصْدِيقُ كَلِمَتِهِ : وە بەڕاست دانانی وشەی خۆی، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ **اللّه**

بِأَنْ : بەوەی

يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ : داخیلی بەهەشتی بکات، بیباتە بەهەشتەوە

أَوْ يَرْجِعَهُ : یان بیگەڕێنێتەوە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی مَنْ

إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي : بۆ ئەوماڵەی ئەوتۆ

خَرَجَ مِنْهُ : دەرچووە لێی، دەرچووە لەو ماڵەی، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ مَسْكَن

مَعَ مَا : لەگەڵ ئەوەی

نَالَ : بەدەستی هێناوە

مِنْ أَجْرٍ : لە ئەجر و پاداشت

أَوْ غَنِيمَةٍ : یان غەنیمەت و دەستکەوت

## ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەکە

**جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ** : واتا جیهادی کرد لە پێناو بەرز کردنەوەی تەوحید و لَا إِلَهَ إِلَّا اللّه

**وَتَصْدِيقُ كَلِمَتِهِ** : مەبەست تێیدا یان بریتییە لە بەڕاست دانانی دوو شاهێدییەکە أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا **اللَّهُ** وَأَشْهَدُ أَنَّ **مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ** یە یان بریتییە لە بەڕاست دانانی ئەو هەواڵانەی **اللَّه تَعالَى** باسی کردووە دەربارەی گەورەیی پاداشتی موجاهیدان.

**يُدْخِلَـهُ الْجَنَّـةَ** : مەبەسـت تێیـدا یـان ئەوەیە بیبـاتە بەهەشـتەوە بەبێ لێ پرسینەوە و سزا یان بیباتە بەهەشتەوە هەر لەو کاتەوەی دەمرێت، هەروەک **اللّه تَعالَى** فەرموویەتی { وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ} [ آل عمران: ١٦٩ ]

وە **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { **إِنَّ أَرْوَاحَ الشُّهَدَاءِ فِي طَيْرٍ خُضْرٍ تَعْلُقُ مِنْ ثَمَرِ الْجَنَّةِ، أَوْ شَجَرِ الْجَنَّةِ** }[٥٩]

**واتـای فەرمـوودەکە** { بێگومان ڕوحی شـەهیدەکان لەناو زگی باڵندەیەکی سـەوزدان، لە بەروبـوومی بەهەشـت دەخـۆن یـان لە داروبـاری بەهەشـت دەخۆن }

**إِلَى مَسْكَنِهِ** : دوو خوێندنەوەی تێدایە مَسْكَن و مَسْكِن، جەمع و کۆیەکەی بریتییە لە مَساكِن، مَسْكَن واتا ماڵ

[٥٩] رواه الترمذي حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ

## بەخشین بۆ جیهاد لە پێناو اللە تعالَى

عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ

{ جَـاءَ رَجُـلٌ بِنَاقَـةٍ مَخْطُومَـةٍ، فَقَـالَ : هَـذِهِ فِي سَـبِيلِ اللَّهِ. فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ : لَـكَ بِهَـا يَـوْمَ الْقِيَامَةِ سَبْعُمِائَةِ نَاقَةٍ كُلُّهَا مَخْطُومَةٌ }[٦٠]

**واتای فەرموودەکە**: لە باوکی مەسعودی ئەنصارییەوە فەرموویەتی { پیاوێـک هـات بە وشـترێکی جڵەوکـراوە، جـا فەرمـووی ئەو وشـترە جڵەوکراوە لە پێناو **اللّە تعالَى** یە - ئەو وشترە سەدەقەیە بۆ جیهاد لە پێناو **اللّە تعالَى** - جا **پێغەمبەر** ﷺ فەرمووی: لە بۆ تۆ هەیە لە قیامەت دا لە بری ئەو وشترە دا حەوت سەد وشتر هەر هەموویان جڵەوکراون }

### واتای وشەکان

جَاءَ رَجُلٌ : پیاوێک هات

بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ : بە وشترێکی جڵەو کراو

[٦٠] رواه : مسلم والنسائي وابن المبارك وأحمد وابن حبان و الدارمی...

مَخْطُومَـةٍ : لغـاو كـراو، جڵەوكـراو، هەوسـاركراو، دەم و مـل بەپەت بەستراو

فَقَالَ : جا فەرمووی

هَذِهِ : ئەو وشترە جڵەوكراوە

فِي سَـبِيلِ اللَّهِ : لە ڕێگای **الـــلَّه** یە، لە پێنـاو **الـــلَّه** یە، سـەدەقەیە بـۆ بەرزكردنەوەی وشەی تەوحید

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ : جا فەرمووی نێردراوی **اللّه**

لَكَ : بۆ تۆ - هەیە -

بِهَـا : بەهـۆی ئەو وشـترە جڵەوكـراوە، البـاءُ للسَّـبَبِيَّة، بەهـۆی ئەو وشترەی بەخشیوتە، لەبری ئەو وشترەی بەخشیوتە

يَوْمَ الْقِيَامَةِ : لە ڕۆژی قیامەت

سَبْعُمِائَةِ نَاقَةٍ : حەوت سەد وشتر

كُلُّهَا : هەموویان، هەموو ئەو وشترانە، ئەو هائە دەگەڕێتەوە بۆ نَاقَةٍ

مَخْطُومَةٌ : جڵەوكراو و لغاو كراون

##  ڕوونكردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەكە

**نَاقَةٍ** :هِيَ الأُنْثَى مِنَ الإِبِل، والجَمْعُ: أَيْنُقٌ و نُوقٌ و نِيَاقٌ، نَاقَةٍ: بەوشتری مێیە دەوترێ جەمع كۆیەكەی بریتیە لە أَيْنُقٌ و نُوقٌ و نِيَاقٌ

**هَذِهِ : النَّاقَةُ المَخْطُومة**، ئەو وشترە لغاوكراوە

**فِي سَبِيلِ اللَّهِ** : أي: صدَقةٌ لِلجِهَاد فِي إعْلاءِ كَلمةِ **اللَّــه** واتا: ئەو وشترە جڵەوكراوە سەدەقە بۆ تێكۆشان بۆ بەرزكردنەوەی تەوحید و لا إِلَهَ إِلَّا **الله**

**سَبْعُمِائَةِ نَاقَةٍ** : یەك وشتری دا حەوت سەد وشتر لەجیاتی وەردەگرێتەوە لە قیامەت، یان پاداشتی حەوت سەد وشتری بۆ دەنوسرێت، **اللَّه تَعالَى** ش فەرموویەتی لە قورئان{ مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّائَةُ حَبَّةٍ } [سورة البقرة : ٢٦١]

**واتاكەی** { نموونەی ئەو كەسانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن لە پێناو **اللَّه تَعالَى** دا وەكوو نموونەی جوتیارێك وایە دەنكە دانەوێڵەیەك دەروێنێ پاشان ئەو دەنكە حەوت گوڵە گەنم ئەگرێ لەهەر گوڵە گەنمێك دا سەد دەنكی تیایە - واتا دەگاتە حەوت سەد - }

## هەڕەشەی نەبەخشین لە پێناو الله تعالی دا

**اللّه تَعالَى** فەرموویەتی { وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ ۛ وَأَحْسِنُوا ۛ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ }

**واتاكەی** { ببەخشن لە پێناو **اللّه تَعالَى** بۆ بەرزكردنەوەی تەوحید و وشەی **اللّه**، بەدەستی خۆتان خۆتان لەناو مەبەن - بە نەبەخشین لە ڕێی **اللّه** - وە چاكەكاربن بێگومان **اللّه** چاكەكارانی خۆش دەوێت }

عَنْ حذيفة رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ { وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ } قَالَ : **نَزَلَتْ فِي النَّفَقَةِ** [٦١]

**واتاكەی** : لە پێشەوا حوذەیفەوە { وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ} دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دابەزیوە دەربارەی بەخشین لە پێناو **اللّه**

**وَقَالَ القرطبي { قَالَ حُذَيْفَةُ بْنُ الْيَمَانِ و ابْنُ عَبَّاسٍ و عَطَاءٌ وعِكْرِمَةُ وَ مُجَاهِدٌ وَجُمْهُورُالنَّاسِ: المَعْنَى: وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ: بِأَنْ تَتْرُكُوا النَّفَقَةَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ }** [٦٢]

**واتاكەی**: قورتوبی وتوویەتی لە تەفسیرەكەی دا { پێشەوا حوذەیفەی كوڕی یەمان و ابن عباس وعەتاء وعیكریمە وموجاهید وجمهوری خەڵكی وتویانە و اتای **وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ**: لەبەروەی وازتان هێناوە لە بەخشین لە

---

[٦١] رواه البخاري

[٦٢] تفسير القرطبي

پێناو **الـلَّه تَعـالَى** دا: ڕوونتر بڵێم: بە هیلاک دەچن و لەناو دەچن ئەگەر نەبەخشن لەپێناو بەرزکردنەوەی تەوحید ولَا إِلَهَ إِلَّا **اللَّه**

هەرکاتێک قسەیەکی حەق ئەکەیت یان کارێکی گرنگ دەکەی بۆ دینەکەی **اللَّه** کەسانێکی جاهیلی دونیا ویستی ترسنۆک پێت دەڵێن: بۆ بەدەستی خۆت خۆت بە هیلاک دەدەی، نازانن ئەو ئایەتە لەسەر ئەو کەسانە دابەزیوە کە وازیان هێنابوو لە بەخشین بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای تەوحید و لَا إِلَهَ إِلَّا **اللَّه**

## یارمەتی دانی جەنگاوەر لە پێناو اللّه

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ مَـنْ جَهَّـزَ غَازِيًـا فِي سَـبِيلِ اللَّهِ فَقَـدْ غَـزَا، وَمَـنْ خَلَـفَ غَازِيًـا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا }[٦٣]

واتای فەرموودەکە: **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { هەرکەسێک پێداویستی جەنگاوەرێکی ئامادە کرد لە پێناو **اللّه تعالی** ئەوە بێگومان جەنـگ و غەزای کـردووە، وە هەر کەسـێک ئاگـاداری مـاڵ و منـاڵی جەنگاوەرێک بێت و سەرپەرشتیان بکات بە چاکە لەپێناو **اللّه تَعَالَی** ئەوە بێگومان جەنگ و غەزای کردووە }

### واتای وشەکان

مَنْ جَهَّزَ : هەرکەسێک ئامادەی کرد، ڕێکی خست

غَازِيًا : جەنگاوەرێک، غازیەک، تێکۆشەرێک

[٦٣] رواه : البخاري ومسلم وأبو داود والترمذي والنسائي وابن ماجه والدارمي وأحمد وابن حبان والطبراني والبيهقي

فِي سَبِيلِ اللَّهِ : له پێناو **اللَّه تـعالَى**، بۆ بەرزکردنەوەی وشـەی تەوحيد ولَا إِلَهَ إِلَّا **اللَّه**

فَقَدْ غَزَا : بێگومان غەزای کردووە، بێگومان جەنگی کردووە

وَمَنْ : وە هەرکەسێک

خَلَـفَ : جێـی گـرتەوە، هەسـتا بە شـوێنگرتنەوەی لە ئاگـاداربوون و سەرپەرشتی کردنی ماڵ و منداڵی جەنگاوەرەکە.

غَازِيًا : غازیەک، جەنگاوەرێک

فِي سَبِيلِ اللَّهِ : له پێناو **اللَّه**

بِخَيْرٍ : بە خێر و چاکە

فَقَدْ غَزَا : بێگومان غەزای کردووە، بێگومان جەنگی کردووە

## ڕوونكردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەكە

**مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا** : أي: هيأ له أسباب سفره، واتا: هۆكارەكانی سەفەری بۆ ئامادە كرد

**فَقَدْ غَزَا** : **ئیبن حیبان** دەربارەی فَقَدْ غَزَا فەرموويەتی { **إِنَّهُ مِثْلهُ فِي الأَجْرِ، وَإِنْ لَمْ يَغْزُ حَقِيقَةً** } واتا: یارمەتیدەری موجاهیدەكە پاداشتی وەک موجاهیدەكە وایە، ئەگەرچی لەڕاستی دا خۆشی جیهادی نەكردبێت

**بِخَيْرٍ** : أي : بالإحسان إليهم بما كان يُحسنه هو حين كان معهم، واتا : بە چاكەكردن لەگەڵیان بەو شێوەیەی كە جەنگاوەرەكە لەگەڵیان چاک بوو لەوكاتەی كە لەلایان بوو

قَالَ **عبد الله بن مسعود** رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ { **لَأَنْ أُجَهِّزَ سَوْطاً فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ حَجَّةٍ بَعْدَ حَجَّةِ الإِسْلام** }[٦٤]

**واتاكەی**: عبداللَّه ی كوڕی مەسعوود فەرموويەتی { ئەگەر قامچیەک ئامادە بكەم لە بۆ جیهاد پێناو **اللَّه تَعالَى** خۆشەويستترە لەلام لە حەج كردنێک لەدوای حەجی فەرزەوە }

[٦٤] رواه الطبراني في معجم الكبير

## شەهید بەجلی خوێنەوە دەنێژرێت

عَـنْ جَـابِرٍ قَـالَ : قَــالَ النَّبِــيُّ ﷺ {إِدْفِنُــوهُمْ فِي دِمَــائِهِمْ " يَعْنِي يَوْمَ أُحُدٍ، وَلَمْ يُغَسِّلْهُمْ}[٦٥]

واتــای فەرمــوودەکە: لە جابرەوە فەرموویەتی: **پێغەمـبەر** ﷺ فەرموویەتی { بیان نێژن بە جلی خوێناویانەوە " واتا لە ڕۆژی جەنگی ئوحود ، وە نەیشۆرین }

### واتای وشەکان

ادْفِنُوهُمْ : بیان نێژن ، بیان شارنەوە

فِي دِمَائِهِمْ : بەخوێنەکانیانەوە، بەجلی خوێناویانەوە

دِمَاء : خوێنەکان جەمع و کۆیە بۆ وشەی دَمْ

يَوْمَ أُحُدٍ : ڕۆژی ئوحود ، جەنگی ئوحود

وَلَمْ يُغَسِّلْهُمْ : وە نەیشۆرین

[٦٥] رَوَاهُ : البُخَارِي و أَحْمَد وغيرهما

##  ڕوونكردنه‌وه‌ى زياتر له‌سه‌ر ئه‌م فه‌رمووده‌يه‌

له‌ گێڕانه‌وه‌يه‌كى تردا به‌م شێوه‌يه‌ هاتووه‌

**عَنْ جابر بن عبد الله رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ {... وَأَمَرَبِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا وَلَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِمْ}**[٦٦]

**واتـاكه‌ى**: له‌ جابره‌وه‌ **الله تعالَى** لێى ڕازى بێت فه‌رموويه‌تى { **پێغه‌مبه‌ر** ﷺ فه‌رمـانى كـرد به‌ شـاردنه‌وه‌يان به‌ جلـى خوێناويـيانه‌وه‌، وه‌ نه‌شـۆران وه‌ نوێژيشى له‌سه‌ر نه‌كردن }

له‌م فه‌رمووده‌يه‌دا ئه‌وه‌مان بۆ ده‌رده‌كه‌وێت كه‌وا **پێغه‌مبه‌ر** ﷺ نوێژى نه‌كـردووه‌ له‌سـه‌ر شـه‌هيدى جه‌نـگ و جيهـاد، به‌ڵام فه‌رمـووده‌يه‌كى تـرى صه‌حيحمان هه‌يه‌ كه‌ **پێغه‌مبه‌ر** ﷺ نـوێژى كـردووه‌ له‌سـه‌ر شـه‌هيدان، ئه‌مه‌ش فه‌رمووده‌كه‌يه‌

**عَنْ عقبة بن عامر قَالَ { صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى قَتْلَى أُحُدٍ }**[٦٧]

**واتـاكه‌ى**: له‌ عوقبه‌ى كوڕى عامره‌وه‌ فه‌رموويه‌تى { **پێغه‌مبه‌ر** ﷺ نوێژى كرد له‌سه‌ر كوژراوانى جه‌نگى ئوحود }

بۆيه‌ زانايان جياوازن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ى نوێژ له‌سه‌ر شه‌هيدى جه‌نگ و جيهاد ده‌كرێت يـان نـا، پێشـه‌وا مـاليكى كـوڕى ئه‌نه‌س و پێشـه‌وا شـافيعى

[٦٦] رواه البخاري

[٦٧] متفق عليه

خۆشەویســت و پێشــەوا ئەحــمەد لە وتەیەکی دا پێیــان وایە نــوێژ ناکرێــت لەســەر شــەهید.، پێشــەوا ئەحــمەد لە وتەیەکی تریــدا دەفەرموێــت ئەگەر نوێژیشی لەسەر بکرێت کێشە نییە

وَقَالَ سليمان بن ناصر العلوان { وَأَصَحُّ الأَقْوالِ فِي المَسْئَلَةِ: أَنَّهُ مُخَيَّرٌ بَيْنَ الصَّلاةِ عَلَيْهِ وَتَرْكِهِ لِمَجِيءِ الأَحَادِيثِ بِكُلِّ واحِدٍ مِنَ الأَمْرَيْنِ }

**واتــاکەی**: سولەیمانی کوڕی ناصر العلوان وتوویەتی { ڕاستترینی وتان لەم بابەتەدا: ئەوەیە سەرپشک دەکرێت لە نێوان نوێژ لەسەر کردنی و نوێژ لەسەر نەکردنی لەبەر هاتنی فەرموودەکان بە هەردوو جۆرییەوە، واتا دروستە نوێژ لەسەر کردن و نوێژ لەسەر نەکردنی }

عَنْ عبد الله بن عمر: {أَنَّ عُمَرَبْنَ الْخَطَّابِ غُسِّلَ، وَكُفِّنَ، وَصُلِّيَ عَلَيْهِ، وَكَانَ شَهِيدًا، يَرْحَمُهُ اللَّهُ }[٦٨]

**واتــاکەی**: لە عبداللّەی کوڕی عومەرەوە **اللّە تعالَى** لێیان ڕازی بێت فەرموویەتی {بێگومان عومەری کوڕی خەتاب شۆردرا و کفن کرا و نوێژی لەسەرکرا، وە عومەر شەهید بوو **اللّە تعالَى** ڕەحمی پێ بکات }

پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس فەرموویەتی { عَنْ أَهْلِ الْعِلْمِ ، أَنَّهُمْ كَانُوا يَقُولُونَ : الشُّهَدَاءُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يُغَسَّلُونَ، وَلَا يُصَلَّى عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ، وَإِنَّهُمْ يُدْفَنُونَ فِي الثِّيَابِ الَّتِي قُتِلُوا فِيهَا }

---

[٦٨] موطأ مالك

**واتــاكـەی** { لە ئەهلی علم و زانستەوە ئەوان دەیان وت: شـەهیدانی جەنگ و جیهاد لە پێناو **اللَّه** ناشـۆردرێن، وە نوێژ لەسـەر هیچیان ناکرێت، وە بێگومان هەر لەو جلە دا دەشاردرێنەوە کە تێیدا کوژراون }

**قَالَ مالك : وَتِلْكَ السُّنَّةُ فِيمَنْ قُتِلَ فِي الْمُعْتَرَكِ، فَلَمْ يُدْرَكْ حَتَّى مَاتَ. قَالَ : وَأَمَّا مَنْ حُمِلَ مِنْهُمْ، فَعَاشَ مَا شَاءَ اللَّهُ بَعْدَ ذَلِكَ ؛ فَإِنَّهُ يُغَسَّلُ، وَيُصَلَّى عَلَيْهِ، كَمَا عُمِلَ بِعُمَرَبْنِ الْخَطَّابِ**}[٦٩]

**واتــاكـەی**: پێشـەوای خۆشەویسـت مالیکی کوڕی ئەنەس فەرموویەتی { ئەوە سـوننەتە بـۆ ئەو کەسـەی کـوژراوە لە شـوێنی جەنـگ و کوشـتاردا، جـا پێی نەگەن تـاوەکوو دەمرێـت - ئەوە ناشـورێت و نـوێژی لەسـەر ناکرێـت - پێشـەوا مالیک فەرمووی: ئەو کەسـەی هەڵدەگیرێت لە بریندااران جا دەژی ئەوەندەی **اللَّه** بیەوێت دوای بریندارییەکەی پاشـان وەفـات دەکات ئەوە دەشـۆردرێت و نوێژی لەسـەر دەکرێت وەکوو ئەوەی کرا بۆ پێشـەوا عومەری کوڕی خەتاب }

تەنها ئەو شـەهیدە بە جلی خوێنـاوییەوە دەنێژرێـت کە لە جەنـگ و جیهـاد دا کوژراوە نەک جۆرەکانی تری شـەهید

---

[٦٩] موطأ مالك

## بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێری موجاهیدانە

قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ

{ وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ }[٧٠]

واتـــای فەرمـــوودەکە: **پێغەمــبەر** ﷺ فەرموویەتی{وە بزانن بێگومان بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکانە }

## واتای وشەکان

وَاعْلَمُوا : وەبزانن

أَنَّ : بێگومان

الْجَنَّةَ : بەهەشت

تَحْتَ : لەژێر

ظِلَالِ : سێبەرەکان کۆی (ظِل)ییە ظِل واتا سێبەر

السُّيُوفِ : شمشێرەکان ، شیرەکان ، خەنجەرەکان ،، سُيُوف کۆی (سَيْف )ییە سَيْف واتا شمشێر

[٧٠] رواه : البخاري و مسلم و أبو داود و الترمذي و أحمد وابن أبي شيبة و الحاكم و البيهقي

## ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر ئەم فەرموودەیە

**السُّـيُوفِ** : لەم فەرمـوودەیەدا تەنهـا شمشـێر باسـکراوە چـونکە شمشـێر لەهەموو ئالەتەکانی تری جەنگ و جیهاد زیاتر بەکار دەهێنرا لەوکات

**أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلَالِ السُّـيُوفِ** : بێگومان جەنگ و جیهاد باشترین ڕێگایە بۆ چوونە بەهەشتەکەی **اللَّه تَعالَى**

## خۆزگە مەخوازن بگەن بە دوژمن

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ لَا تَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا }[٧١]

واتـــای فەرمـــوودەکە: پێغەمـــبەر ﷺ فەرمـوویەتی { خـۆزگە مەخـوازن بـگەن بە دوژمـن، خـۆ ئەگەر پێیـان گەیشـتن و ڕووبەڕوویـان بوونەوە ئەوە ئارام بگرن }

### واتای وشەکان

لَا تَمَنَّوْا لِقَـاءَ الْعَـدُوِّ : خـۆزگە مەخـوازن بـگەن بـە دوژمـن، تەمەنـا مەکەن بگەن بە دوژمن

لَا تَمَنَّوْا : خۆزگە مەخوازن، تەمەنا مەکەن

لِقَاءَ : گەیشتن

الْعَدُوِّ : دوژمن

فَإِذَا : جا ئەگەر

[٧١] رواه : البخاري ومسلم وأحمد والطبراني وابن عوانة والبيهقي

لَقِيتُمُوهُمْ : گەیشتن پێیان، گەیشتنە دوژمن، وشەی هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ الْعَدُوِّ

فَاصْبِرُوا : ئارام بگرن، صەبر بگرن

## ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر ئەم فەرموودەیە

**لَا تَمَنَّـوْا** : ئەسـڵەکەی لَا تَتَمَنَّـوْا بـووە و یەک لەم دوو تـائە حەذفکـراوەو ڕەشکراوەتەوە

**لِقَـاءَ الْعَـدُوِّ** : ئیضـافەی چـاوگە بـۆ لای مەفعـولەکەی دوای حەذفکردنی فاعیل، لە ئەسڵ دا بەم شێوەیە لقاءكم العدو واتا گەیشتنتان بە دوژمن

## خێر بەنێوچەوانی ئەسپەکانەوەیە تا قیامەت

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ }[٧٢]

واتای فەرموودەکە: **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی{ئەسپ خێری و بەرەکەتی بە نێوچەوانەوە هەیە تا ڕۆژی قیامەت(بەهۆی ئەسپەوە پاداشت و غەنیمەت بەدەست دەهێنرێت)}

### واتای وشەکان

الْخَيْلُ : ئەسپ

نَوَاصِيهَا : نێوچەوانی ئەسپەکان، ئەم هائە بۆ خَیْل دەگەڕێتەوە ، نَواص کۆی ناصِیَة یە

الْخَيْرُ : خێر ، چاکە ، بەرەکەت

إِلَى : تا

يَوْمِ الْقِيَامَةِ : ڕۆژی قیامەت

---

[٧٢] رواه : البخاري و مسلم و النسائي و ابن ماجه و أحمد و مالك وابن حبان والبيهقي

## ڕوون کردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەکە

**الْخَيْلُ** : المراد ما يتخذ للغزو، مەبەست لە ئەسپ ئەو ئەسپەیە کە ئامادە دەکرێت بۆ جەنگ و جیهاد

**بِالنَّاصِيَةِ** : المراد، الشَّعْرُ المُسْتَرْسِلُ عَلَى الجَبْهَةِ : مەبەست لە ناصية لەم فەرموودەیەدا ئەو پرچەیە بە نیوچەوانی ئەسپ دا شۆڕبۆتەوە

**الْخَيْرُ** : وَقَدْ جَاءَ تَفْسِيرُهُ بِالْأَجْرِ وَالغَنِيمَةِ واتا: خَيْر هاتووە لە تەفسیرەکەی دا بە پاداشت و دەسکەوت و غەنیمەت

**إِلَى يَوْمِ القِيامَةِ** : فِيهِ بَشَارَةٌ إِلَى أَنَّ الجِهَادَ مَاضٍ ، وَمُسْتَمِرٌّ إِلَى يَوْمِ القِيامَةِ

**إِلَى يَوْمِ القِيامَةِ** : ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە جیهاد هەردەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی قیامەت

قَالَ ابن عبد البر { **وَقَدِ اسْتَدَلَّ جَمَاعَةٌ مِنَ العُلَمَاءِ بِأَنَّ الجِهادَ مَاضٍ إِلَى يَوْمِ القِيامَةِ**}[73]

**واتا**: ابن عبد البر فەرموویەتی { کۆمەڵێک لەزانایان ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە کە جیهاد و تێکۆشان دەمێنێتەوە تا ڕۆژی قیامەت }

قَالَ أحمد بن حنبل { **أَنَّ الْجِهَادَ مَعَ كُلِّ إِمَامٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ** }[74]

---

[73] التَّمْهِيد لابن عبد البرّ ١٤ / ٩٧

[74] سنن الترمذي

**واتـــاكـەی**: پێشـەوای ئەهلی سـوننەو جەماعە ئەحـمەدی كـوڕی حەنـبەل فەرموویەتی: دەربارەی ئەم فەرموودەیە **الْخَيْرُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَة** { بێگومان جیهاد و تێكۆشان لەگەڵ هەموو پێشەوایەک دا هەتا ڕۆژی قیامەت دەمێنێتەوە }

وَقالَ البخاري فِي صَحِيحِهِ { **بَابٌ : الْجِهَادُ مَاضٍ مَعَ الْبَرِّ وَالْفَاجِرِ؛ لِقَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ** }

**واتـــاكـەی**: پێشـەوا بوخـاری فەرمـوویەتی لە صـەحیحەكەی دا { جیهـاد و تێكۆشان هەر دەمێنێتەوە لەگەڵ پێشەوای چاك و خراپ دا........ }

وە هەروەها كەوسەج دەڵێت پرسیارم كرد لە پێشـەوا ئەحمەد دەربارەی ئەو فەرموودەیە { **الْخَيْرُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ** }

پێشـەوا **ئەحمەد** فەرمووی: **الجِهادُ إِلَى يَوْمِ القِيامَة** : واتا جیهاد و تێكۆشان هەتا قیامەتە، پێشـەوا **ئیسحاقی ڕاهەویهی** فەرمووی جیهاد و تێكۆشان هەتا ڕۆژی قیامەتە هەروەک پێشەوا ئەحمەد فەرموویەتی }[٧٥]

ئەم فەرموودەیە لە گێڕانەوەیەكی تردا بەم شێوەیە هاتووە، قَالَ **رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ { **الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ** }[٧٦]

وە لەگێڕانەوەیەكی تـردا بەم شێوەیە هـاتووە قَـالَ **رَسُـولُ اللَّـه** ﷺ { **الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ** }[٧٧]

---

[٧٥] كتاب المسائل رواية الكوسج

[٧٦] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

[٧٧] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

## جیهاد كردن تا قیامەت دەمێنێت

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

{ لَا تَـزَالُ عِصَـابَةٌ مِـنْ أُمَّتِـي يُقَـاتِلُونَ عَلَـى أَمْـرِ اللَّهِ، قَـاهِرِينَ لِعَـدُوِّهِمْ، لَا يَضُـرُّهُمْ مَـنْ خَـالَفَهُمْ حَتَّـى تَـأْتِيَهُمُ السَّـاعَةُ وَهُـمْ عَلَى ذَلِكَ }[٧٨]

واتای فەرموودەكە: **پێغەمبەر** ﷺ فەرموویەتی { بە بەردەوامی كۆمەڵێك لە ئوممەتەكەم دەجەنگن لەسەر دین و فەرمانی **اللّه**، سەركەوتوو و براوەن بەسەر دوژمنانیان، نەیارانیان ناتوانن زیانیان لێ بدەن تاوەكوو قیامەت دێت ئەوان هەر لەسەر ئەم حاڵە دەمێننەوە }

## واتای وشەكان

لَا تَزَالُ : بەردەوام، بە بەردەوامی

عِصَابَةٌ : كۆمەڵێك، جەماعەتێك

مِنْ أُمَّتِي : لە ئوممەتەكەم

يُقَاتِلُونَ : دەجەنگن، كوشتار ئەكەن، شەڕ ئەكەن

[٧٨] رواه : مسلم وابن حبان والطبراني والحاكم وابن عوانة

عَلَى أَمْرِ اللَّهِ : لەسەر فەرمانی **اللّه**، لەسەر دینی **اللّه**، لەبەر ئەوەی **اللّه** فەرمانی شەڕکردنی داوە

قَاهِرِينَ : براوەن، زاڵن، سەرکەوتوون

لِعَدُوِّهِمْ : بەسەر دوژمنانیان، وشەی هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ عصَابة

لَا يَضُرُّهُمْ : زەرەر لەوان نادات، زیان لەو کۆمەڵە موجاهیدە نادات، وشەی هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ عِصَابَة

مَنْ خَالَفَهُمْ : ئەوەی پێچەوانەیان ئەکات، ئەوانەی موخالیفی ئەو کۆمەڵە دەکەن، وشەی هُمْ دەگەڕێتەوە بۆ عِصَابَة

حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ : هەتا بۆیان دێت قیامەت، تا قیامەتیان بەسەر دا دێت

وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ : وە ئەوان لەسەر ئەم شێوەو حاڵەن، وە ئەو کۆمەڵەیە هەر شەڕ ئەکەن و براوەن بەسەر دوژمنانیان

##  ڕوونکردنەوەی زیاتر لەسەر فەرموودەکە

**لَا تَزَالُ** : ئەم لایە لای نافیەیە بۆیەش فعلەکەی دوای خۆی مەرفوعە، تَزَالُ : فیعلی موضاریعی زَیلَ یە وەکوو عَلِمَ یَعْلَمُ

**لَا تَزَالُ** : المراد به: ملازمة الشيء مەبەست لێی بەردەوامبوونی شتێکە

**عِصَابَةٌ مِنْ أُمَّتِي** : أي جماعة منهم: واتا کۆمەڵێک لەوان لە ئوممەتەکەم

**يُقَاتِلُونَ عَلَى أَمْرِاللَّهِ** : أي : لأجل ما أمر **اللّــه تَعَــالَى** بمقاتلته واتا : شەڕ ئەکەن لەبەر ئەوەی **اللّه تَعالَى** فەرمانی کردووە بەشەڕکردنیان

**وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ** : أي : والحال أنهم مقاتلون قاهرون لعدوهم : واتا : حاڵی ئەم کۆمەڵە ئەوەیە شەڕ ئەکەن و سەرئەکەون بەسەر دوژمنانیاندا

قَالَ سليمان بن ناصر العلوان { **وَقَدْ رُوِيَ مِنْ وُجُوهٍ كَثِيرَةٍ وَهُوَ مُتَواتِرٌعَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ** }

**واتــاکەی**: سولەیمانی کوڕی ناصر العلوان وتوویەتی { ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت کراوە بە چەندین شێوەوە، وە ئەم فەرموودەیە موتەواترە لە **پێغەمبەرەوە** ﷺ }

## زانایانی ئوممەت فەرموویانە دەربارەی ئەم فەرموودەیە

قَالَ ابن المبارك رَحِمَهُ اللَّه { هُمْ عِنْدِي أَصْحَابُ الحَدِيثِ }

**واتاكەی**: پێشەوا عبداللَّه ی كوڕی موبارەک فەرموویەتی { ئەو كۆمەڵە لەلای من فەرمووده ناسانن }

وَقَالَ أحمد بن حنبل رَحِمَهُ اللَّهُ { إِنْ لَمْ يَكُونُوا أَهْلَ الحَدِيثِ فَلا أَدْرِي مَنْ هُمْ ؟}

**واتاكەی**: پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل فەرموویەتی { ئەگەر ئەو كۆمەڵەیە فەرموودەناسان نەبن ئەوە نازانم ئەوان كێن ؟ }

قَالَ علي بن المديني { هُمْ أَصْحَابُ الْحَدِيثِ }

**واتاكەی**: پێشەوا عەلی كوڕی مەدینی فەرموویەتی { ئەو كۆمەڵەیە فەرمووده ناسانن}

قَالَ البخاري رَحِمَهُ اللَّه { وَهُمْ أَهْلُ الْعِلْمِ }

**واتاكەی**: پێشەوا بوخاری فەرموویەتی { ئەو كۆمەڵەیە خاوەن علم و زانستن}

بەڵێ بێگومان فەرموودەناسانی ئوممەت گەورەترین جەنگیان كردووە و هەموو هەوڵێكیان داوە بۆ پاراستنی دین و سوننەت

قَالَ أحمد بن حنبل رَحِمَهُ اللَّهُ { وَالجِهَادُ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَ اللَّهُ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى آخِرِ عُصْبَةٍ يُقَاتِلُونَ الدَّجَّال }

**واتـــاكەی**: پێشەوا ئەحمەدی كوڕی حەنبەل فەرموویەتی { جیهاد هەر دەمێنێتەوە لەوكاتەی **الـلّه پـێغەمـبەری** ﷺ ناردووە تا كۆتا كۆمەڵ كە لەگەڵ دەججال دەجەنگن }

قَالَ أبو زرعة الرازي و أبو حاتم الرازي رَحِمَهُما اللَّهُ { وَأَنَّ الجِهَادَ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ نَبِيَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى قِيامِ السَّاعَة }[79]

**واتـــاكەی**: ئەبو زورعە و ئەبو حاتم الرازی كۆدەنگی هەموو زانایانی سەلەفیان نەقلكردووە بۆمان و فەرموویانە { بێگومان جیهاد هەر دەمێنێتەوە لەوكاتەی **اللّه پێغەمبەری** ﷺ ناردووە هەتا قیامەت }

قال الإمامُ أبو عوانة رَحِمَهُ اللَّهُ: بَابُ بَيَانِ إِثْبَاتِ الْجِهَادِ { وَأَنَّهُ مَاضٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ، وَأَنَّهُ لَا يَزَالُ قَوْمٌ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْحَقِّ يَذُبُّونَ عَنِ الدِّينِ ، وَيُقَاتِلُونَ عَنْهُ ، وَيُنْصَرُونَ عَلَى مَنْ خَالَفَهُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ }[80]

**واتـاكەی**: ئەبو عەوانە بابێكی هێناوەتەوە بەناوی بەیانكردنی جێگیربوونی جیهاد و تێكۆشان، دەفەرمووێت { جیهاد و تێكۆشان تا قیامەت دەمێنێتەوە، وە بەردەوام كۆمەڵێك دەمێننەوە لە ئوممەتی **موحەممەد** ﷺ لەسەر حەق

[79] عقيدة الرازيين

[80] مستخرج أبي عوانة

